# ئیبن سینا و
# هەرەسهێنان بەپزیشکیتی کۆن

جهاد خاوەری



پێرست

# پێشەکی

"بەناوی خوا "

ئەم كتێبەی بەردەستت هەوڵێكە بۆ ئاشـناكردنی  خوێنـەری كورد بـە هەوڵەكانی ئەم زانایە لـەبواری پزیـشكیدا و ئـەو داهێنانـەی لـە زانـستی پزیـشكیدا ئـەنجامی داون،، لێكۆڵینەوەكـە پـاش ئـەوەی چـەند سـاڵێك لەهـەوڵی ئـەوەدا بـوم كـە بتـوانم كتێبێكـی تـەواو لەسـەر پزیـشكانی موسـڵمان دابنـێم بـەلاَم بـەهۆی نـەبونی دەرفەتـەوە نـەمتوانی كارەكـەم زوو بەزوو تەواو بكەم هەربۆیە پێم خۆش بوو ئەم بابەتەی ئیبن سـینا وەكو دیاریەك ببەخشمە دۆستانی شارستانیەت و بیری ئیسلامی تـاوەكو سـودبەخش بێـت بۆیـان و سـودی لێـوەربگرن، بـەو هیوایـەی خـوای گـەورەش بەرەكـەت بخاتـە كارەكەمـەوە و بتـوانم ئـەوەی ماومـە بـۆ تەواوكردنی ئەو كتێبـە لـەبارەی پزیـشكانی موسـڵمانەوە تـەواوی بكـەم. ئیبن سینا كەسایەتیەكی بێوێنەی زانست دۆسـت و بیریـار و كیمیـازان و پزیشكی سەردەمی خۆی بـووە هەوڵـەكانی لـەبواری پزیـشكی و كیمیـا و فەلسەفەدا بێوێنـەن و جێگـای بایـەخی زانایـانی سـەردەمەكەی خـۆی و سـەدەكانی ناوەڕاسـت بـووە، منـیش لـەم ژیاننامـەدا توانیومـە زۆرتـرین كارەكانی ئەم زانایە بخەمە ڕوو لەنوسـینی كتێـب و هەوڵـەكانی بـەدوای زانستدا، یەكێ لەو شتانەی كـە گۆڕانكاریـە لـەم نوسـینەمدا ئەوەیـە كـە ناونیشانی كتێبە عەرەبیەكانم وەرگێراوە تاوەكو خوێنەر بزانێ كە ئـەو كتێبـەی بـاس لـەچ لایـەنێك ئـەكات و ئاسـانكاریەك بێـت بـۆی و چـاوی هیلاك نەبێ بەدیار كتێبی عەرەبیەوە. هەروەها لایەنی دژایەتی كردنی ئەم زانایەم ڕونكردۆتەوە و بەرپەرچی ئـەو دژایەتیانـەم داوەتـەوە لـەو

بـوارەدا. لەکۆتاییـدا بـەهیوام بـۆ خۆتـان هـەمووی بخوێنـەوە و چـێژی لێببەن و سود بەخش بێت بۆتان.

سەرکەوتن لەخواوەیە

جهاد خاوەری

شەوی ١٥-١٦/ ١٢/٢٠١٣



وتەیەکی کۆنی ئەوروپی هەیە، دەڵێ:

"هەریەکێ کە بیەوێ پزیشکێکی باش بێت، ئەبێت وەك ئیبن سینا بێت"

## ئیبن سینا (٣٧٠ – ٤٢٨ك / ٩٨٠ – ١٠٣٧ز[1])

## ئیبن سینا کێیه[2]؟

هەمان پرسیار ئەبو عبید جوزجانی (جورجانی) قوتابی ئاراستەی خۆی کرد ئەویش وتی:

باوکم (عبدالله) خەڵکی ناوچەی (بەڵخ)بوو، چووە بوخارا لە رۆژانی (نوح کوڕی مەنصور)[*] وەکو کارگوزارێکی (دەوڵەتی سامانی)[**] لە گوندێك پێی دەوترا ( خورمیثن) لەوێ باوکم لەگەڵ خێزانێکی چاکدا ئاشنا بوو، هاوسەری خۆشی لەو خێزانە دیاری کرد کرد کچێ بوو ناوی ( ستارە)بوو، لەوێ ژیانی هاوسەریان پێك هێنا و پاشان من لەدایك بووم و دواتریش (براکەم[***])، پاشان گەڕاینەوە بوخارا و لەوێ چومە دەرسی مامۆستایانی قورئان و ئەدەب، کاتێ تەمەنم بووە ١٠ساڵ مومارەسەیەکی باشی قورئان و ئەدەبم دەکرد بەشێوەیەك ببومە جێی سەرسامی مامۆستایان و دەوروبەرەکەم.

لەسەرچاوەکانی دیکەشدا بەم شێوەیە هاتووە[3]:

ئیبن سینا دەڵێ: (من کوڕی عبدالله کوڕی حسین کوڕی ابن سینا). باوکم خەڵکی بەلخ بوو لە ولاتی ئەفغان. کارگوزاری دەوڵەتی سامانی بوو، سەرەتا لە ناوچەی

---

[1] د. طه عبدالمقصود عبدالحمید أبو عبیة: الحضارة الإسلامیة، ج١/ ص٣٢٨ – ٣٢٩.

[2] عبدالمنعم الهاشمي: علماء وعباقرة المسلمون، ص٢١١.

[*] نوح کوڕی مەنصور، هەشتەم فەرمانڕەوای دەوڵەتی سامانیە، ماوەی فەرمانڕەوایەتیەکەی ٣٦٦ – ٣٨٧ك.

[**] ڕەچەڵەکی ئەم خێزانە (سامانی) ئەگەڕێتەوە بۆ (بهرام جور) کە بنەماڵەیەکی کۆنی فارسیە لەسەردەمی خەلیفە مەئموندا بەهۆی پشتیوانی لێکردنیانەوە بەرەبەرە هاتنە پێشەوە تاوەکو توانیان دەسەلأت بهێنن و بۆ ماوەی (١٧٠ساڵ و ٦ مانگ) فەرمانڕەوایەتی ولأتی خۆراسان بکەن. بڕوانە / د. حسن ابراهیم حسن: تأریخ الإسلام ، ج٣/ ص٧١ – ٧٣.

[***] بە دوو شێواز ئەم دەقەی ئیبن سینا هاتووە کە باس لە سەرەتاکانی هاتنە دونیای خۆی دەکات، لە هەندێکدا نوسراوە یەکەم منداڵ کەلەدایك بوو من بوم و پاشان براکەم (مەحمود). لە هەندێکی دیکەشدا دەوترێ براکەم (حارث) و دواتر من.

[3] بڕوانە/ إبن أبي أصیبعة: عیون الأنباء، ص٤١٧. البیهقي: تأریخ علماء الإسلام، ص٥٢.

(خرمیپن) له دەوروبەری بوخارا و پاشان باوکم کارەکەی خۆی گواستەوە گوندی (ئەفشنە)... بۆ زیاتر ئاشنابون و نزیکی لە خەڵکەکەی کە زۆر گونجاو بون لەگەڵیدا داخوازی لە کچێك کرد بەنێوی (ستارە) لەو هاوسەرگیرییە کوڕێکیان بوو ناویاننا حوسین). کونیەی ئیبن سینایە و ناودارترین پزیشکی سەردەمی خۆی و شارەزاترین کەسی فەلسەفەی ئیسلامیە لە رۆژهەلاّتدا، باوکیشی لە بنەماڵەی ئیسماعیلیەکانە کە ناسراون بە (باطنیەکان*)[4].

---

* باطني: یەکێکن لە گروپە ئیسلامیەکان، کە پشت بەناوەرۆك و ناخی مرۆڤ دەبەستنن و کاریان لەسەر تەئویلکردنی ئایەتە قورئانیەکانە، هاوشێوەی خورمی و قەرامیتی و ئیسماعیلی و مزدکیەکان. هەروەها لە هەندێ ڕوشەوە لە گروپە ئیسلامیە صوّفیەکان دەچن. دامەزرێنەرانی ئەم گروپەش بریتین لە (عبدالله کوڕی میمون قداح ، محمد کوڕی حەسەن). بانگەوازەکەشیان زیاتر بلاّوبویەوە لەنێو خەڵکی بەحرەین و باکوری ئەفریقیا و دیلەم،... لە گرنگترین بۆچونەکانیشیان(هەرشتێك لە زاهیردا کرا لە باتنیشدا هەیە. دەکرێ هەموو شتێکی دابەزێنراو تەئویل بکرێ. حەلاّلکردنی ئەو شتانەی چێژ بەخشن و شەهوەت بەرز دەکەنەوە. فەرز لایان بەگەورە سەیرکردنی ئیمامەکانیانە. مانای حەرامکراوەکانیش حەرامکردنی خەلیفایەتی ئەبوبکر و عومەرە. گومانکردن لەتەواوی کتێبە ئاسمانیەکان. بڕوانە/ أحمد عطیة الله: القاموس الإسلامی، ج١/ ص٢ص٢٥٦. شوقی أبو خلیل: أطلس الفرق والمذاهب الإسلامیة. ص٤٤٣.

ئیبن سینا لەبارەی پەیوەندی باوکی بەبنەماڵەی ئیسماعیلیەوە دەڵێ: (باوکم لەو کەسایەتیانە بوو کە بە ئیسماعیلی دەژمێردران و باسی نەفس و عەقڵی لەسەر شێوازی ئەوان دەبیست). سەرەتای دەرکەوتنی ئەم گروپە لە رۆژئاوا بوو، بەلاّم لە دەورەی موکتفیدا بەرەو لاوازی چون و ئیسماعیلیەکان چونە ژێر باریان و خۆیان پەیوەست کرد بەوانەوە و توانیان بیان بوژێننەوە، بەوەش دەسەلاّتیان دەرکەوت لە میسردا بە دامەزراندنی دەوڵەتی فاتیمی و سامانیەکان لە خۆراسان لەدەورەی نوح کوڕی مەنصوری سامانی کە ئیسماعیلی بوو، ئەوەبوو بۆ ئەم مەبەستەش باوکی ئیبن سینای لە خۆی نزیك کردەوە و دەستخۆشانەی پێدەدا تاوەکو سوربێت لەسەر بلاّوکردنەوەی بیر و فیکریان لەنێو خەڵکیدا. بڕوانە/ إبن سینا: باروّن کارادفو/ ت. ع: عادل زغیتر، ص١٣١.

4 العقاد: شیخ الرئیس إبن سینا، دارالمعارف مصر.

## پێگەیشتن و گەورەبونی

ئەمیری دەوڵەتی سامانی (نوح کوڕی مەنصور) کاتێ عبداللە ی کردە والی شاری بوخارا، عبداللە ش خۆی و خێزانی چونە ئەوێ کە ئەوکات ئیبن سینا تەمەنی ٥ ساڵان بوو[5]، لەوێ لەنێو کۆشکێ لە کۆشکەکانی ئەمیر نوح نیشتەجێ بون. ئەوکات بوخارا شارێکی زۆر جوان و دڵگیر و کراوە و خۆش بوو، ناسراو بوو بەزۆری بینا و کۆشك و مزگەوت و کێڵگە و باخچەی ڕازاوە.... کوڕەکەی عبداللە (ئیبن سینا) بنیاتی سەرەتاکانی زانستی خۆی لەو کۆشکەوە دەست پێکرد، بەوەی هەموو شەوێ لەدوای نوێژی عیشا پۆلی زانایان و زمانزانان و فەقیە و قوتابیان کۆدەبونەوە لە ماڵی عبداللە و ئاڵوگۆڕ و گفتوگۆی زانستی خۆیان دەکرد تا درەنگانێکی شەو بەچەندین گفتوگۆی زانستی زمانی و فەلەك و مەنتیق و.... کە ئەم جۆرە دانیشتنانە کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر بیری ئیبن سینا دانا کە هەر لەسەرەتاوە هەوڵی بیرکردنەوە و تێڕامان بێتەوە لەسەر کەسەکان و هەڵسوکەوتیان و بیریان و تێڕابمێنێ لەسروشت و دەوروبەرەکەی و گیانداران و ڕووەك و .... تاوەکو کۆمەڵێك پرسیاری لا گەلاڵە بێت و بەشوێنیاندا عەوداڵ بێت، هەروەها ئەمە هەلێك بوو تاوەکو لەم ڕێگەیەوە بەشێك لەو پرسیارانەی کە بە مێشکیدا دەهاتن وەڵامەکەیانی دەست بکەوێت و بەمەش بیر و فیکری بەرەو پرسیاری قوڵتر و قوڵتر بڕوات. خاڵێکی تر لەو سودانەی کە ئیبن سینا بەدەستی هێنا لەم جۆرە گفتوگۆی شەوانەیە ئەوەبوو کە زیاتر هەوڵی فێربونی زانست بدات و فێری شێوازی قسەکردن بێت لەلایەك و لەلایەکی دیکەشەوە فێری چۆنیەتی پرسیارکردن بێت[6].

کەسێك بوو هەر لەسەرەتاوە بووە جێگای سەرسامی خانەوادەکەی و حەزی بەیاریکردن و تێکەڵی منداڵان نەدەکرد، بەڵکو حەزی لە خوێندنەوە و لەبەرکردن بوو، کاتێکیش لەگەڵ براکەی دەچونە دەرێ بۆ کات بەسەربردن،

---

[5] د. أرشيد يوسف بن ارشيد: الحضارة الإسلامية، ص٢٥٧.

[6] محمد فتحي صبري: الشيخ الرئيس إبن سينا، ص٣ -٤.

کتێب و نوسراوەکانی بەجێ نەدەهێشت و لەگەڵ خۆیا ئەیبردن و لەوێ کاتـەکانی بـە بیرکردنـەو و وربونـەوە لـە سروشـت و دەوروبەرەکـەی بەسـەر ئـەبرد و بـە پرسیارەکانی دایك و باوکی توشی سەرسوڕمان دەکرد بەوەی دەیپرسی:

- شێوەی دنیا چۆن بووە پێش ئەوەی خوا گەردون دروست بکات؟

- ئەو خەڵکەی دەخرێنە بەهەشت یان دۆزەخ و بەهەتا هەتایی تیایدا ئەمێننەوە، ئەی پاشان .... چی؟

بـەم شـێوەیە بـەردەوام بـوو لـە هەوڵـدان بـۆ فێربـون و لەبـەرکردنی دەقـەکان و کردنـەوەی گرێـی پرسـیارەکان، تـاوەکو ئـەوەی لـە سـەرەتاکانی تەمەنیـدا و لـە تەمەنی ١٠ساڵیدا هـەموو قورئـانی پـیرۆزی لەبـەر کـرد، ئەمـە جگـە لـە فێربـونی زمانی عەرەبی و لەبەرکردنی چەندین فـەرمودە و بەیتـە شـیعر کەبەشـێوەیەکی زۆر ڕەوان شـیکردنەوەی بـۆ ماناکـانی دەکـرد. پاشـتر لەلایـەن باوکیـەوە نێردرایـە بەرخوێندن لای مامۆسـتای نـاودار و بـەناوبانگی خۆراسـان (ئیـسماعیلی زاهیـد)و لەوێ دەرسی فیقهی خۆی درێژە پێدا .... پاش ماوەیەك داوای لە باوکی کرد کەوا حـەز ئـەکات شـارەزایی لـە بیرکـاری هیندیـدا هـەبێت، ئـەویش بـۆ ئـەو مەبەسـتە بردیە لای هاوڕێیەکی خۆی کە پاقلـە فـرۆش بـوو و شـارەزایی ژمێریـاری هینـدی بوو، ماوەیەکیش لەخزمەتی ئەودا بوو تاوەکو زانـستەکەی بەدەسـت هێنـا، پاشـان بیـستی کـەوا (عبـداللە نـائلی) هـاتووە بـۆ شـارەکەیان و بـەناوبانگ بـوو بەدەرسـە فیکریەکان و نازناوی فەیلەسوفیان لێنرابوو، داوای لە باوکی کـرد کـەوا بیهێنێتـە ماڵی خۆیان و دەرسی تایبەتی پێبڵێت لەبارەی فەلـسەفە و مەنتیقـەوە، باوکیـشی ئەو کارەی بۆ بەجێ هێنـا و مـاوەی ٢سـاڵ لـەلای خـەریکی دەرس خوێنـدن بـوو[٧].

ئیبن سینا بۆ خۆی باس لە سەرەتاکانی فێربونی دەکات لە بواری زانستی کـەلام و فەلـسەفەدا و دەڵـێ:( بـاوکم لەسـەر ڕێبـازی باتنیـەکان بـوو، بەهـەمان شـێوە براکەشـم، زۆرکـات گفتوگۆیـان دەکـرد و منـیش گـوێم لێـدەگرتن و هەسـتم بـە وتەکانیان دەکرد بەڵام نەفسم وەری نەدەگرت[٨])، دواتر دەڵێ:( پاشان عبداللە نائلی

[7] محمد فتحي صبري: الشيخ الرئيس إبن سينا، ص٧ — ١٠.

[8] عبدالمنعم الهاشمي: علماء وعباقرة المسلمون، ص٢١٣.

هات بۆ بوخارا کە بەفەیلەسوف ناودەبرا و باوکیشم هێنای بۆ ماڵی خۆمان و داوای لێکرد کە فێرم بکات، من پێشتریش فیهم لای ئیسماعیلی زاهید وەرگرتبوو، لەو کەسانەبوم کەلە هەر بوارێکدا بمخوێندایە زۆر قوڵ دەبومەوە تێیدا و ڕەخنە و داوای زۆرم لەبەرامبەرەکەم دەکرد کە فێری دەکردم، هەمیشە بەهۆی وروژاندنی هەندێ پرسیار نائلی سەری سوڕ دەما لەوەی کە من بەم بچوکیە و کە قوتابی ئەوم ئاوا پرسیار لەبارەی مەنتیقەوە بکەم. یەکەم کتێبێکیش خوێندم لە بواری مەنتیقدا (ئیساغوجی)بوو). کە ئەو کات تەمەنی ١٤ ساڵ بوو.

پاشان ئیبن سینا ڕوی کردە زانستی پزیشکی و بە وتەی خۆی:( زانستی پزیشکی، زانستێکی قورس و گران نەبوو بۆیە سەرکەوتن تیایدا کارێکی دژوار نەبوو)، بۆ ئەم مەبەستەش ڕوی کردە لای هەریەکە لە (ئیبن سەهلی مەسیحی و ئەبی مەنصور حەسەن کوڕی نوحی قەمەری)و زانستی پزیشکی لێوەرگرتن.... بەلاَم ئەو زانستەی بەلای ئیبن سیناوە قورس و گران بوو فەلسەفە و مەنتیق بوو، هەربۆیە رۆژانە کاتێکی زۆری بۆ ئەو بوارە تەرخان کردبوو، وەك خۆی دەڵێت:( ویستم لەو زانستەدا قوڵ ببمەوە، بۆیە دوبارە گەڕامەوە بۆ خوێندنەوەی مەنتیق و تەواوی بەشەکانی فەلسەفە و بەشەو و بەرۆژ خەریك بوم، شەوێك بەتەواوی چاوانم لێك نەناوە). ئیبن سینا لەو ماوەیەدا بەچەندین بیرکردنەوە و دیدی فەلسەفی جیاجیا ئاشنابوو دەربارەی گەردون و ژیان و بیرکردنەوەی مرۆڤەکان و دنیا و ئاخیرەت و زیندوبونەوە و .... دەوترێ بەڕادەیەك عاشق و شەیدای زانست بو بوو کە ئیدی بۆ ساتێکیش لێی دانەدەبرا، بەیانیان تا نیوەرۆ دەرسی فیقە و بابەتی دینی دەخوێند لای زانایانی ئاینی و دوای نیوەڕوانیش هەتاوەکو نوێژی خەوتنان لای نائلی(ناتلی) زانستی فەلسەفە و مەنتیق و سروشت و بیرکاری دەخوێند، شەوانیش لەدوای نوێژی عیشا تا درەنگانی شەو لە دانیشتنەکانی زانایاندا دادەنیشت کە لەماڵی عبداللە دەبەستران لەبارەی زانستە جۆربەجۆرەکانەوە. لەپاش ئەوەی نائلیش ماڵی ئەوانی بەجێهێشت ئیتر بۆ خۆی دەستی دایە کتێب خوێندنەوە لەبارەی مەنتیق و فەلسەفەوە و هەوڵی زۆریدا تاوەکو لەو بوارەدا بتوانێ توانایەکی باشتر بەدەست بهێنێت. ماوەیەك خەریکی

خوێندنـــەوەی کتـــێبی (میتافیزیـــك)ی ئەرســـتۆ بـــوو کـــە پـــەی بـــە هەنـــدێ لـــە نهێنیەکانی کتێبەکە نەدەبرد و زیاتر لە ٤٠ جار بەشێکی ئەو کتێبەی خوێنـدەوە بەلاّم بە قوڵی لە ماناکانیان نەدەگەیشت، وەك خۆی بۆمان دەگێرێتـەوە و دەڵـێ:( کتێبم دەخوێندەوە لەبارەی زانستی میتافیزیك(ئـەو دیـو سروشـت)، لـە بەشـێکدا ٤٠جار خوێندمەوە بەلاّم لێی تێنەدەگەیشتم تاوەکو ئەوەی ئەوەم لا دروسـت بـوو کە بڵێم ئەم کتێبـە لـە ئاسـتی تێگەیـشتنی منـدا نیـە.. پـاش ماوەیـەك رۆژێکیـان بـەناو بـازاڕدا دەگـەڕام، پیاوێـك بـەرەو ڕوم هـات و تێبێکـی پێـدام و داوای سـێ درهەمی لێکردم، پێـی وتم کـە پێویـستیم بـە پارەکەیـەتی، منـیش لەبـەر ئـەوەی کتێبەکە هەرزان بوو پارەکەم پێیدا، کاتێ سەیرم کرد بینیم کتێبی ئەبی نەصری فارابیـە لـەبارەی نهێنیـەکانی کتـێبی(میتافیزیـك)ی ئەرسـتۆ، گەڕامـەوەماڵـەوە و بەخێرایی دەستم کـرد بەخوێندنـەوەی و لەگـەڵ خوێندنـەوەی دەرکـم بـەنهێنی نوسینەکەی ئەرستۆ دەکرد و بەمەش سوکنایم بۆ هات).

ئیبن سینا لـە بـواری پزیـشکیدا پـاش ئـەوەی چووە لای هـەردوو پزیـشکی بەناوبانـگ( حسین کوڕی نوحی قەمەری و ئەبو سهل حسین) و ماوەیـەك دەرسـی پزیـشکی خوێنـد، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش دەرمـان دروسـتکردن لـە هەریەکـە لـە کەرەستە خاوەکانی (ئاژەڵی و ڕووەکی و کانزایی)لە ڕوانگەی زانـستی کیمیاییـەوە بە ڕێگای کارلێککردن و دڵۆپاندن تاوەکو لە کاتی چارەسـەرکردنی نەخۆشـیەکاندا سـودی لێوەربگرێـت، هەربۆیـە زوو بـەزوو نـاوی لـە بوخـارا بلاّوبـۆوە وەکـو پزیشکێکی لێهاتوو کە ئەو کاتە هێشتا تازە ببووە ١٦ ساڵ.

لەگەڵ ئەوەی ناوبانگێکی باشـی لـەبواری پزیـشکیدا دەرکـرد، بـەلاّم نـەبووە کەسـێکی لـە خۆبـایی و خۆبـەزلزان، بـەڵکو دەسـتی دایـە چارەسـەری کەسـانی نەخۆشی کەم دەرامـەت و چارەسـەری دەکـردن و دەسـتی یارمـەتی و هاوکـاری بـۆ ڕادەکێشان تاوەکو کەمێك لە ئێش و ئازارەکانیان سارێژ بکات.

## لـه کۆشکی ئەمیردا*

وەك پێشتر وتمان ئیبن سینا لە بوخارا دەژیا کە بەشێ بوو لە خۆراسان کە لەلایەن (نوح کوڕی مەنصور) کە ئەمیری دەوڵەتی سامانی بوو بەڕێوە دەبرا. لەم ماوەیەدا بوو کەوا هەواڵ بڵاوبویەوە بەنێو وڵاتی خۆراساندا و هەواڵیش گەیشتە شاری بوخارا کەوا ئەمیری وڵات (نوح کوڕی مەنصور) نەخۆش کەوتووە و پزیشکانی وڵاتیش دەستەوسانن لە چارەسەرکردنیدا، بۆیە لە ماوەیەکی کەمدا هەواڵ هێنرا بۆ کۆشك و نێو و ناوبانگی ئیبن سینایان بە پاشا ڕاگەیاند کە کوڕی (عبدالله)یەو کەسێکی زۆر لێهاتوو و شارەزایی بواری پزیشکیە، بۆیە ئەویش فەرمانیدا کەوا بیهێنن تاوەکو لەم ئێش و ئازارە ڕزگاری ببێت. کاتێ ئیبن سینایان هێنا، پاش ئەوەی پاشای ئارام کردەوە و چەند پشکنینێکی بۆ کرد، بۆی دەرکەوت کە پاشا توشی قورحەی گەدە و ئیلتهابی کۆڵۆن بووە، بۆیە داوای لە پاشا کرد کە خۆی بەدوور بگرێت لە خواردن جگە لە خورما هیچ جۆرە شتێکی تر نەخوات تاوەکو تەندروستی دێتەوە سەر خۆی، ئەوەبوو پاش چەند ڕۆژێك پاشا شیفای بۆ هات و چاکبۆوە لە نەخۆشیەکەی. پاشاش لەبەرامبەر ئەمەدا داوای لە پزیشکی گەنج کرد کە ئەو کات تەمەنی (١٨)ساڵ بوو کە چ داوایەکی هەیە تاوەکو بۆی جێبەجێ بکات، ئەویش بە ئەمیری وت ڕێگەم بدە کە بچمە کتێبخانەی کۆشکەوە تاوەکو سود لە زانستەکانی ئەو کتێبانە وەربگرم، ئەمیریش

---

* ڕایەکی دیکەش هەیە لەوەی دەوترێ کاتێ وەزیری وڵات چۆتە بوخارا بۆ ئەوەی ئیبن سینا بێنێت بۆ کۆشك، ئەو خەریکی چارەسەری منداڵێکی هەژار و دەست کورت بووە، بە وەزیرەکەی وتووە هەموو مرۆڤەکان لە ئادەمن و ئادەمیش لە خۆڵ کەواتە چ منداڵێکی هەژار نەخۆش بێت و چ پاشای وڵات لای من هیچ جیاوازیەکی نیە، بۆیە تا ئەم منداڵە چارەسەر نەکەم نایەم..... دەشوترێ بە نوێنەرەکەی پاشای وتووە: ئەمیر دەبێت بۆ خۆی بێت بۆ لای و لێرە وەکو باقی نەخۆشەکانی تر ( شوێنێکی دیاری کراوی هەبوو سەیری نەخۆشی تیادا ئەکرد و چارەسەری دەرکردن) چارەسەری بکات. ئەوانیش لە جلوبەرگێکی هەژارانەدا خۆی و وەزیرەکەی هاتون و ماوەی ٧ڕۆژ لەژێر فەرمانی ئەودا بون تاوەکو پاشا حاڵی بەرەو چاکبون چووە و گەڕاوەتەوە کۆشك.

بەو پەڕی خۆشحاڵیەوە داواکەی قبوڵ کرد و جێگایەکی باشی بۆ دابینکرد لە کۆشکدا تاوەکو ڕۆژانە چووە کتێبخانەوە و کتێبی ئیستعارە کرد بێتە ئەو شوێنە و بیانخوێنێتەوە. ئەوتریَ بۆ ماوەی ٢ساڵ لەکۆشکدا بەو شێوەیە ماوەتەوە تاوەکو زۆربەی کتێبەکانی ئەوێی خوێندەوە کە بەیەکێك لە کتێبخانە گەورەکانی ئەو سەردەمە دادەنرێ و کتێبەکانی خۆیان لە (٣٠) هەزار کتێب دەدا.

ئەمیر لە پاش ٢ساڵ دوبارە توشی هەمان نەخۆشی بۆوە و ئەمجارە زۆر بە سەختی گرتی و ماوەی زۆری نەدا و گیانی دەرچوو*. لە پلانێکی داڕێژراویشدا کتێبخانەی کۆشك سوتێنرا و نرایە سەر ئیبن سینا و گوایە ئەو سوتاندویەتی چونکە ئەو ڕۆژە کتێبخانە سوتا، ئەو چوو بووە سەردانی دایك و باوکی، هەربۆیە فەرمانی دەستگیکردنی درا و ماوەیەك لە سجندا توند کرا، بەڵام بەهۆی تێکچونی بارودۆخی وڵات و دروستبونی پشێوی لە دوای مردنی ئەمیرە و بێتوانایی کوڕەکانی لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا، لەبەرامبەریشدا دەوڵەتی غەزنەوی** هاوسێی لەو پەڕی گەشە و بەهێزیدا بوو بەهۆی بەهێزی فەرمانڕەوایی (محمود کوڕی سبکتکین***) هەربۆیە ئەمەی بە هەلزانی و پەلاماری وڵاتی خۆراسانیدا و دەستی بەسەردا گرت، ئەمەش هەلێك بوو بۆ ئیبن سینا لە زیندان هەڵبێت و بگەڕێتەوەماڵەوە.

---

* دەوتریَ کەوا لەلایەن سێ کورەکەیەوە پلان داڕێژراوە بۆ ئەوەی ئەمیر لەناو بەرن و بۆ خۆیان دەسەڵات بگرنە دەست و بە ئارەزووی خۆیان فەرمانڕەوایی بەسەر وڵاتدا بکەن... بەڵام کاتێکیش پلانەکەیان سەری گرت بووە شەڕ و ململانێ لەنێوان خۆیاندا و هەریەکەیان پلانی لە دژی ئەویتریان دادەڕشت و کێشە و ئاژاوە وڵاتی گرتەوە و ئەمەش لەلایەن غەزنەویەکانەوە بە هەلزانرا و دەستگیرا بەسەر وڵاتی خۆراساندا و کۆتایی بە دەوڵەتی سامانی هێنا.

** دەوڵەتی غەزنەوی(٣٥١ – ٥٨٢ك/ ٩٦٢ – ١١٣٢ز) فەرمانڕەواییان لە وڵاتی ئەفغان و بەنجابدا بوو، لە ماوەی دەسەڵاتیاندا ٢٢ فەرمارەوا حوکمیان کردووە .

*** ٣٨٨ – ٤٢١ك/ ٩٩٨ – ١٠٣٠ز، فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی غەزنەوی کردووەو بە بەهێزترین فەرمارنەوای دەوڵەتەکە دادەنرێ و حەوتەم فەرمانرەوای دەوڵەتەکەیە. گرنگترین کاریشی فەتحکردنی وڵاتی هیندستانە کە ماوەی ٢٠ساڵ لە شەڕدا بوو. بڕوانە/ د.حسن إبراهيم حسن: تأريخ الإسلام، ص٩١ – ٩٥.

ئیبن سینا لە درێژەی ژیانیدا بەهۆی ڕوداوە سیاسیەکان و ڕودانی شەڕ و ئاژاوە و نائارامی ولاٚتی ئێرانەوە توشی نەهامەتی و دەربەدەری زۆر هاتووە تاوەکو بتوانێ لە کەشێکی ئارام و هێمندا زانست و زانیارییەکەی خۆی بەگەڕ بخات، هۆکارەکەشی بەهۆی ئەو لاوازییەوە بوو کە خیلافەتی عەباسی پێیدا تێئەپەڕی بەهۆی لاوازی خەلیفەکانی وەکو( طائع و قادر و قائم ) کە بە لاوازترین خەلیفەکانی دەوڵەتی عەباسی دەژمێردرێن، بەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانی چەند دەوڵەتۆکەیەکی سەربەخۆ لە ناوچە جیاجیاکانی ژێر دەسەلاٚتی دەوڵەتی عەباسی کە زۆر جاران دەبونە مەترسی بۆ دەوڵەتی عەباسی و هەندێ کاتیش لەنێو خۆیاندا و هەریەکەیان بۆ فراوانکردنی سنوری دەسەلاٚتی خۆی هێرشی دەکردە سەر هێزی بەرامبەرەکەی.

## چونی بۆ خوارزم

کاتێ ئیبن سینا بەوەی زانی کە ولاٚتی خۆراسان خەریکە لەلایەن مەحمودی غەزنەویەوە دەگیرێ زۆر بەخێرایی لە خۆراسان دەرچوو و چووە خوارزم لە باکوری خۆراسان بۆ لای ئەمیر(عەلی کوڕی مەئمون) کە پایتەختی (جورجانیە) بوو، ئەمیریش بەهاتنی بۆ ولاٚتەکەیان زۆر خۆشحاڵ بوو پێشوازیەکی گەرمی لێکرد و داوای لێکرد کەوا کۆمەڵەیەکی زانستی دابمەزرێنێ لە زانایانی خوارزم لە بوارە جیاجیاکاندا وەك ( بیرونی لە زانستی بیرکاریدا، ئەبو سهلی مەسیحی فەیلەسوف، ئەبوخیر خماری پزیشك،...) لەبەرامبەریشدا دەوڵەت موچەیەکی مانگانەی باشی بۆ بڕیەوە تاوەکو کارەکەی و زانستەکەی لە خزمەتی خەڵکی خوارزمدا بەکاربهێنێت، لەم ماوەیەدا لە جورجانیە چەندین کتێبی نوسی لەبارەی دینەوە لەوانە( الحكمة العروضية، المختصروالاوسط، المبدأ والمیعاد، الحاصل و المحصول، البر و الإثم) هەروەها کتێبێکی زۆر باشیشی لەبارەی زانستی فەلەکەوە نوسی کە زۆربەی زانیارییە گەردونیەکانی لە خۆی گرتبوو بەناوی (أرصاد الكلية)، لە پاش ماوەیەك مانەوەی لەوێ، ئەمیر سوڵتان مەحمودی غەزنەوی کە دەسەلاٚتی بەسەر ناوچەی جورجانیە و خوارزمیشدا دەڕۆیشت و ئەمیری ئەوێ لەژێر فەرمانیدا بوو، داوای لێکرد کەوا هەستێت بە کۆکردنەوەی

سەرجەم زانایانی ناوچەی جورجانیە، کاتێ ئیبن سینا ئەمەی بیست کەوا سوڵتان مەحمودی غەزنەوی بەتەمای بەسەرکردنەوەی زانایانی جورجانیە بەناچاری ئەویشی بەجێهێشت، کاتێ ئەمە گەیشتەوە سوڵتانی غەزنەوی کە ئیبن سینا لە فەرمانەکەی دەرچووە و هەڵهاتووە، فەرمانیدا کە وێنەی بەهەموو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیدا هەڵبواسرێ و بە کەسێکی یاخی و دەرچوو لە فەرمانی سوڵتان بناسرێ و هەرکەسێکیش بتوانێ دەستگیری بکات ئەوا لەلایەن سوڵتانەوە پاداشت دەکرێ، بۆیە ئیتر ئیبن سینا جارێکی تر نەیتوانی بگەڕێتەوە خوارزم یان خۆراسان لای دایکی و براکەی و بۆ هەتا هەتایە لێیان دابڕا.

## چونی بۆ دەوڵەتی زیاریە

ئیبن سینا بە بیانوی گەڕان بەدوای زانستدا خۆی لە سەردانەکەی سوڵتانی غەزنەوی دزیەوە و ڕوی کردە لای ئەمیر (قابوس وشکمیر)ئەمیری دەوڵەتی زیاریە کە دەکەوتە باشوری دەریاچەی قەزوین، کە یەکێك بوو لە ئەمیرە بەهێزەکانی ئەو سەردەم و بەهیچ شێوەیەك لەژێر دەسەلاتی دەوڵەتی غەزنەویدا نەبوو بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ترسی لەوە هەبوو کە لەگەڵ دەوڵەتی غەزنەویدا بکەوێتە کێشەوە ..... بەلام بەسەر خۆیدا نەهێنا و ئیبن سینای لە خۆگرت و لەو ماوەیەدا دوو کەس بونە هاوڕێ و هاودەمی کە لەوێ ناسینی ئەوانیش ( ئەبی حمد شیرازی و ئەبو عبیدە جورجانی )بون و بونە هاوکاری نوسینەکانی بەتایبەتی (ئەبوعبیدە جورجانی)، لەگرنگترین ئەو دانراوانەی کە لەم ماوەیەدا نوسینی (قانون في الطب)و کتێبی (الشفاء)،هەروەها لەبواری فەلسەفە و کیمیاشدا چەندین دانراوی دانا.... لەوێ بەردەوام بوو لە دەرس وتنەوە تاوەکو ڕۆژێکیان هاوەڵەکەی زۆر بەخێرایی خۆی کرد بە ژوردا و پێی ڕاگەیاند کەوا شار بەهۆی کوژرانی ئەمیر قابوسەوە خرۆشاوە و ئیتر ئێرە بۆ تۆ ئەمین نیە و دەبێ ئێرە بەجێبهێڵین، بۆ ئەوەی خەڵکیش گومانمان لێ نەکەن جلی سۆفیانە لەبەر دەکەین... ئیبن سیناش بەخێرایی هەستا و کتێب و نوسراوەکانی کۆکردەوە و زوو بەزویی لەوێ دەرچون.

**چونی بۆ هەمەدان**

**بەگەیشتنیان بە هەمەدان، هەواڵی نەخۆش کەوتنی (شمس الدولە)ی ئەمیری هەمەدانیان بیست، ئەمەش هەلێکی باش بوو بۆیان تاوەکو جێگای خۆیان قایم بکەن لەناوچەکەدا. هەربۆیە ئەبوعبیدە چووە دەرباری ئەمیر و هەواڵی پێدان کەوا پزیشکێکی لێهاتوی لەگەڵدایە و شارەزاییەکی باشی لەنەخۆشیە جیاوازیەکاندا هەیە، ئەوەبوو ئەمیریش داوای لێکرد لەگەڵ خۆیدا بیهێنێ، بەمەش چووە دەرباری پاشا و پاش ئەوەی سەیری ئەمیری کرد بۆی دەرکەوت کە نەخۆشیەکەی نەخۆشیەکی نەفسیە و جەستەیی نیە، پاش هەوڵ و ماندوبونێکی زۆر لەگەڵی توانی چارەسەری بکات، بەمەش لەدەربار و دەسەڵاتی ئەمیر نزیک بۆوە و لەلایەن ئەمیرەوە خانەیەکی بۆ دابین کرا بۆ دەرس وتنەوەی بە قوتابیەکانی... شێوازی دەرس وتنەوەشی بۆ سێ کات دیاری کرد، بەیانیان تا نیوەرۆ ...... دوای نوێژی عەسر تاوەکو خۆرئاوا بون ...... لەدوای نوێژی عیشاش تا نزیکی خەوتنان، لەکاتی پشودانەکانیشدا مۆسیقایان دەژەنی و ئاوی میوەیان دەخواردەوە بۆ پشودان بەمێشکیان. بەلام پاش ماوەیەك لەمانەوەی بەرەبەرە لەنێو خەڵکیدا تۆمەتیان بۆ دروستکرد بەوەی دەیانوت بیروباوەری دژە دینی و دژە کلتوری بە قوتابیەکان دەڵێ، ئەمەش وای لە سوپا کرد شەوێك هەڵبکەوتنە سەر ماڵەکەی و دەست بەسەریان کرد و کردیانە زیندانەوە و چونە لای (شمس الدولة)ش تاوەکو زوو بەزوو فەرمانی کوشتنی دەربکات، بەلام ئەمیر بەمە ڕازی نەبوو و داوای کرد کەوا لە زیندان بیهێڵنەوە .... لە پاش ماوەیەکی کەم مانەوەی لە زیندان پاشا توشی نەخۆشی (قورحەی گەدە و ئیلتهابی کۆڵۆن) بوو، بۆیە ناچار ئیبن سینایان لە زیندان دەرهێنا تاوەکو چارەسەری پاشا بکات، ئەویش پاش دانانی بەرنامەیەکی باش بۆی و ئامۆژگاری کردنی بەوەی زۆر نەخوات و خۆی لەشەراب بەدوور بگرێت چاك بۆوە. بەلام کاتێ ولاتەکەی کەوتە شەڕەوە لەگەڵ دراوسێکەیدا زوبەزوی دەستی دایەوە شەراب خواردن و بەمەش نەخۆشیەکەی لێ پیس کرد و فەوتاندی .... دوای مردنیشی کوڕەکەی بووە جێنشینی کە ناوی (تاج الدولة)بوو، لەبەر کەمی تەمەنی و ناشارەزای لە**

بـەڕێوەبردنی وڵاتــدا و بەمــەش وڵات کــەوتبووە دەســتی ســەرکردەیی ســوپا و ئەمــەش هەڕەشــەی مانــەوەی ئــیبن ســینای دەکــرد لەوڵاتــدا، بۆیــە خــۆی و قوتابیەکەی هەمەدانیشیان بەجێ هێشت.

## چونی بۆ ئەصفەهان

پـاش ئـەوەی شـوێنێکیان بـۆ مانـەوە نـەما لـە هەمـەدان بەناچـاری ڕێگـای ئەصفهانیان هەڵبـژارد و لـەوێ چـونە لای (عـلاء الدولـة) ، ئـەویش زۆر خۆشـحاڵ بـوو بـە هاتنیـان و شـوێنێکی باشـی پێـدان تـاوەکو تێیـدا بمێننـەوە. عـلاء الدولـة یـەکێك بـوو لـەو ئەمیرانـەی کـە گـوێی بـۆ زانایـان و دانایـان و سـوپا سـالار و ڕاوێژکارەکامی دەگرت و لە کاتە هەستیارەکاندا پرسی پێدەکردن و هەفتانەش لە شەوی پێنج شەممەدا کۆی دەکردنەوە و گوێی لەسەرنج و تێبینیـەکانیان دەگـرت لە بارەی بارودۆخی و وڵات و چاکسازییە پێویستەکانی وڵاتەوە. کاتێکیش هەستی بـە زیرەکـی ئـیبن سـینا کـرد ئەویـشی بانگهێـشت کـرد تـا لەشـەوانی ٥شـەممەدا بەشـداری بکـات، بەمـەش زیـاتر لـە ئـەمیرەوە نزیکبـۆوە و تـوانی دوبـارە لـەوێش درێـژە بەلاوکردنـەوەی زانـستەکەی خـۆی بـدات و ئـەوەبوو تـوانی بـە هاوکـاری قوتابیەکـەی خـۆی ئەبوعبیـدە لـە بـواری فەلەکـدا کتێبـی (الإنـصاف في الإرصـاد) بنوسێت و پاشانیش کتێبی (النجاة) لەگەڵ چەندین نوسراوی دیکە.

## شێخی پزیشك

ئیبن سینا بە قوتابیەکەی خۆی دەڵێ: ( حەزم لە زانـستی پزیـشکی کـرد و بـۆ ئـەو مەبەسـتەش چـەند کتێبـێکم لـەو بارەیـەوە خوێنـدەوە، تێگەیـشتم کـە زانستی پزیشکی زۆر قورس نیە، تـاکو ئـەوەی باشـتر دەسـتم دایـەو لێکۆڵینـەوە و توێکــاریم لەســەر ئەنجامــدا و پاشــان دەســتم دایــە چارەســەرکردنی خەڵکــە نەخۆشـەکان و لەگـەڵ ئەمەشـدا دەرسـی فیقهـی و گفتوگـۆم لـەبارەی زانـستەکانی تریشەوە بوو، وەمن لەو کاتەدا تەمەنم تەنها ١٦ساڵ بوو[9]).

---

[9] عبدالمنعم الهاشمي: العلماء وعباقرة المسلمون، ص ٢١٥.

دکتۆر میر هوفیش لەبارەی پزیشکیەتی ئیبن سیناوە دەڵێ:( ئەبو عەلی سینا هەتاوێك بوو لە جیهانی زانستدا درەوشایەوە، گەرچی زۆرتر بە فەیلەسوف و فیزیکزانی دەناسن بەلاّم دیکتۆریەتیەکەی سەری ئەوروپیەکانی هێناوەتە سور[10]).

ئیبن سینا کەسێکی بەتوانا بوو لە لەبەرکردندا و کەسێکی پێگەیشتوو بوو زوو تێئەگەیشت لە شتەکان، ئەمەش وای کردبوو زوو بەرەو پێشەوە بچێ لە هەر زانستێکدا کە حەزی بکردایە فێر بێت، هەروەها چارەسەرکردنی ئەمیری خۆراسانیش خاڵێکی وەرچەرخان بوو لە ژیانی ئیبن سینادا کەوا لەسەرەتاکانی گەشەی فیکریدا بەو شێوەیە وەکو کەسێکی شارەزا لە پزیشکیدا بناسرێت، وە نوسینی کتێبی (القانون)یش لەم بوارەدا بەخاڵێکی دیکەی گەورەی ئەم زانایە دادەنرێ لە زانستی پزیشکیدا کە دکتۆر میرهوف لەبارەی پەراوی (قانونی ئیبن سینا)وە دەنوسێ:( پەڕاوی قانون، یەکێکە لەشانازییەکانی پزیشکی لەجیهانی ئیسلامیدا، لەدوای سەدەی (١٥)ئەم پەراوە (١٦)جار لە ئەوروپا چاپ و بلاّوکرایەوە، کە (١٥)جاری بە زمانی لاتینی و (١)جاریش بە زمانی عیبری، لەسەدەی (١٦)شدا زیاتر لە (٢٠)جار چاپکرا، وە ئەو تەفسیرانەی بۆ ئەو پەڕاوە بە زمانی لاتینی و عیبری نوسراون یەکجار زۆرن)، پاشان بەردەوام دەبێت و دەنوسێ:( ئەم پەڕاوە تا نیوەی دووەمی سەدەی (١٧) چەند جاران چاپکرا و تا ماوەیەکی زۆریش لەبریتی پەڕاوەکانی دەرسی بوو، وە بێگومان هیچ پەڕاوێکی پزیشکی تا ئێستا و تا ئەم ڕادەیە برەوی نەبووە کە سەرەڕای تەواوی ئەو پێشکەوتنانەی پزیشکی هێشتا لەلایەن زانایانەوە کەڵکی لێوەردەگیرێ. لەوولاّتێکی وەکو فەرەنسا لەم ٧٠ساڵی ڕابردودا پەڕاوی ناوبراو لە بەرنامەکانی دەرسی هەڵگیرا).

سیر تۆماس کلیفۆردیش لەبارەوە دەڵێ:( ئەوروپیەکان باوەڕیان وایە کە دانراوەکانی ئیبن سینا لە پزیشکیدا کتێبەکانی تریان داپۆشی و خستە لاوە،

---

10 سید مجتبی موسوی لاری: دیمەنی شارستانیەتی رۆژئاوا، ل١٥٨.

تەنانـەت ئەوانـەش کـە (ئـەبوقرات)و (جـالینۆس) نوسـیویانە، هـەر لەبـەر ئەمـە دانراوەکانی ئیبن سینا بوون بە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو بۆ خوێندنی پزیشکی لە کۆلێژەکانی پزیشکی ئەوروپا بۆ سەردەمانێکی دوور و درێژ[11]).

## ئەدیب

ئیبن سینا یەکێکی تر لـەو بەهرانـەی کـە هـەیبوو بـونی شـارەزاییەکی بـاش بوو لە زمانی عەرەبیدا، ئەوەش کە وای کرد زیاتر لەم بوارەدا شارەزایی بەدەسـت بێنێت ئەوەبوو، لەیەکێ لەدانیشتنەکاندا لەبارەی چەند مەسائیلێکی فەلسەفیەوە قسەی دەکرد ئەبومەنصور جبائی لەوێ ئامادەبوو کەبەیەکێ لە شارەزایانی زمـان دەناسرێ، لەدوای کۆڕەکە بە پێکەنینێکەوە بە ئیبن سینای وت: (دەزانم شـێخ تـۆ فەیلەسوف و حەکیمێکی باشی، بەڵام ئاستی زمانەوانیت لەو ئاستەدا نیـە). ئـیبن سینا لەدوای ئەم ڕوداوەوە دەستی دایـە بـواری زمانـەوانی و بـۆ مـاوەی ٣سـاڵ لـەو زانستەدا خوێندییـەوە تـاکو ئـەوەی کتـێبی (لـسان العـرب)ی دانـا کەلـە (١٠بـەرگ) پێکهاتووە. لەبواری شیعریشدا خاوەنی چەندین بەیتـە شـیعری بـەپێزە، ئەمـەش بەسـود وەرگـرتن لـەو قورئانـەی کەهـەر لەتەمـەنی ١٠سـاڵیەوە لەبـەری کردبـوو لەگـەڵ چـەندین بەیتــە شـیعری شـاعیرە ناودارەکـان و ئـەو پاشـخانە فیکرییـە گەورەییـەی کـە هـەیبوو وای کـرد زوو بـەزووی لـەبواری نوسـینی شـیعردا بـەرەو پێـشەوە بـچێت و لـە کتێبەکـەی (لـسان العـرب)دا بیانـچنێت و کتێبەکـەی پـێ بڕازێنێتەوە، وەك ئـەم بەیتـە شـیعریەی کـە بـاس لـە هەسـتی حەسـودی خـەڵکی ئەکات بەرامبەری:

عجبٌ لقوم يحسدون فضائلي

مابين عيابي إلى غذالي

عتبوا على فضلي وذموا حكمتي

واستوحشوا من نقصهم وكمال

إني وكيدهم وما عشوا به

---

[11] Britannica 2009, DVD

كالطود يحقر فطحة الأوعال

وإذا الفتى عرف الرشاد النفسه

هانت عليه علامة الجهال[12]

هەروەها لە شانازی کردن بەخۆیەوە دەڵێ:

إني وإن كانت الأقلام تخدمني

كذاك يخدم كفي الصارم الخدم

إني عظمت فليس مصر واسعي

لما غلا ثمني عدمت المشتري

تــەواوی بەیتــە شــیعریەکانی لــەکتێبی (لــسان العــرب)دا تۆمــارکردووە و بەمــەش توانی لە پاڵ نازناوی (شیخ الطبیب) (شیخ الأدیب)یش بۆ خۆی بەدەست بێنێت.

## دانراوەکانی

لەبواری بیرکاری و فیزیکدا

١. رسالة الزاوية (پەیامی گۆشە).

٢. مختصر إقليدس (پوختەی ئیقلیدس).

٣. مختصر الإرتماطيقي (ثوختةى ئيرتماتيقي).

٤. مختصر علم الهيئة (ثوختةى زانستى ڕوو).

٥. مختصر المجسطي (ثوختةى مجستي).

٦. رسالة في بيان عله قيام الارض في وسط السماء (پـەیامێك لـە بـارەی سەرسـامی وەستانی زەوی لەناوەڕاستی ئاسماندا).

هــەمویان بەیەکــەوە لــە بەرگێکــدا چــاپکران بــەناوی (جــامع البــدائع/ کــۆی داهێنانەکان) لە قاهیرە ساڵی ١٩١٧ز.

لەبواری سروشت و گەردونناسیدا

---

[12] العقاد: إبن سينا ، ص ١٢٧ -١٢٨.

١. رسالة في أبطال أحكام النجوم (پەیامێك لەبارەی یاسا بنەڕەتیەکانی ئەستێرەگەرییەوە).

٢. رسالة في الأجرام العلوية (پەیامێك لەبارەی تەنە ئاسمانیەکان).

٣. أسباب البرق و الرعد (هۆکاری دروستبونی چەخماخە و هەورە بروسکە).

٤. رسالة في الفضاء (پەیامێك لەبارەی بۆشایی ئاسمانەوە).

٥. رسالة في النبات و الحیوان (پەیامێك لەبارەی ڕووەك و ئاژەڵەوە).

لەبواری پزیشکیدا

١. القانون في الطب (یاساکانی پزیشکی): مەوسوعەیەکی پزیشکیە و ژمارەی وشەکانی نزیکەی ١ملیۆن وشەیە، لەرۆما ساڵی (١٥٩٣)زدا بلاْوکرایەوە کە لە پێنج بەرگ پێکهاتبوو:

أ. پزیشك گشتی و کارئەندامزانی.

ب. زانستی تەندروستی و دەرمانەکان.

ج. زانستی نەخۆشیەکانی هەموو ئەندامەکان.

د. ئەو نەخۆشیانەی کە تایبەت نین بە ئەندامێکەوە و هەموو لەش دەگرێتەوە.

ز. زانستی مادە پزیشکیەکان و دەرمانەکان و ئامادەکردنیان و پۆلێن کردنیان(الأقرباذین[١٣]).

٢. أدوية القلبية.

٣. دفع المضار الكلية من الأبدان الإنسانية.

٤. القولنج* (کۆڵنج).

٥. رسالة في سياسة البدن وفضائل الشراب (پەیامێك لەبارەی ڕامیاری لاشە و چاکیەکانی شەراب).

٦. رسالة في تشرح الأعضاء (پەیامێك لەبارەی توێکاری جەستەوە).

٧. رسالة في الفصد (پەیامێك لەبارەی خوێن بژان).

---

[13] الشيخ الرئيس إبن سينا: فؤاد حمدو الدقس، ص ١٣ – ١٤.

* نەخۆشیەکە لەڕیخۆڵەدا پەیدا دەبێت و پیسایی و با بەئەستەك لەکۆم دێتە دەرەوە.

**٨. رسالة في الأغذية و الأدوية (پەیامێك لەبارەی خۆراك و چارەسەر).**

**چەند کورتە باسێکیشی نوسیوە لەبارەی:**

**- التشریح (توێکاری).**

**- المجریات في الطب (ئەزمونەکانی پزیشکی).**

**- الألفیة الطبیة المشهورة (هەزارەی پزیشکی بەناوبانگ).**

**لەبواری مۆسیقا**

**لەم بوارەدا تەنها یەك مەقالەی هەیە بەناوی(مقالة جوامع علم/ کۆکراوەی وانەکانی زانست).**

**لەکتێبەکانی تریشدا بەم شێوازە پۆلێنی هەندێ لە نوسراوەکانی کراوە:**

**کتێبەکانی**

**١. المجموع/ کۆکراوەکان (١بەرگ).**

**٢. الحاصل والمحصول/ ئەنجامە بەدەست هاتووەکان(١٠بەرگ).**

**٣. البر والإثم/ چاکە و تاوان(٢بەرگ).**

**٤. الشفاء/ چارەسەر(١٨بەرگ).**

**٥. الإرصاد الکلیة/ ڕوانگە گشتیەکان(١بەرگ).**

**٦. النجاة/ ڕزگاربون(٣بەرگ).**

**٧. الهدایة/ ڕێنومایی(١بەرگ).**

**٨. لسان العرب/ زوبانی عەرەب(١٠بەرگ).**

**٩. الأدویة القلبیة/ چارەسەری دڵەکوتێ(١بەرگ).**

**١٠. الموجز/ کورتە(١بەرگ).**

**١١. بیان زوات الجهة/ ڕونکردنەوەیەك دەربارەی گۆشەی لاکان(١بەرگ).**

**١٢. المعاد/ سەرەنجام(١بەرگ).**

**١٣. المبدأ والمعاد/ سەرەتا و کۆتایی(١بەرگ).**

**١٤. المباحات/ شتە شیاوەکان(١بەرگ).**

**پەیامەکانی**

**ئـیبن ئـەبی ئەصـیبعەی قوتـابی لـە کتـێبی (عیـون الأنبـاء)دا نـاوی هەنـدێ لـە پەیامەکانی هێناوە، بەم شێوەیە:**

**١. القضاء والقدر/ قەدەر و قەزا.**

**٢. الإله الرصدية/ هەڵسورێنەری گەردون.**

**٣. المنطق بالشعر/ مەنتیق لەشیعردا.**

**٤. القصائد في العظمة/ بەیتە مەزنەکان.**

**٥. الحكمة في الحروف/ دانایی لەپیتەکاندا.**

**٦. تعقب المواضيع الجدلية/ ئەنجامی بابەتە مشتومڕەکان.**

**٧. مختصر النبض بالعجمية/ پوختەی لێدانە نادیارەکانی دڵ.**

**٨. الحدود/ سنورەکان.**

**٩. الإشارة إلى علم المنطق/ تیشکێك دەربارەی زانستی مەنتیق.**

**١٠. أقسام الحكمة/ بەشەکانی دانایی.**

**١١. حي بن يقظان/ زیندویي بیَدار.**

**١٢. في أن أبعاد الجسم غير ذاتية له/ لەناو ئەو لایەنانەی ماددەدا کەسـەر بـەخودی ماددە نین. .**

**١٣. الكلام في الهند/ کەلام لەهیند.**

**١٤. الأجرام السماوية/ تەنە ئاسمانیەکان.**

## ئیبن سینا ...... پرۆگرامێکی نوێ

**لەکاتی لێکۆڵینەوە لەم کەسایەتیەدا بـۆت دەردەکـەوێت کـە بەڕاسـتی خـۆی دامەزرێنەری بیر و داهێنانێکی نوێیە کە هاوشێوەی نیە چ لە دەورانی خۆیدا و چ لە پێـشیندا .... بـۆ نمونـە لـە بـواری پزیـشکیدا خـاوەنی (القـانون في الطب)ە کـە تاوەکو ئێستا لەرۆژهەڵات و رۆژئاوا بەدەیان و سـەدان ماسـتەر و دکتـۆرای لەسـەر وەرگیراوە، ئەمەش جگە لە بایەخ و گرنگی ئەم کتێبە نـەبێت لـەبواری پزیـشکیدا چی ترە؟!**

**لەگرنگترین داهێنانەکانی:**

**لەبواری پزیشکیدا**

**ئیبن سینا دەڵێ:( لەبارەی ئەو چارەسەرانەی کە دامئەنان، لەزۆری بونی ئەزمونم بوو لە دیتنی نەخۆشە جۆراوجۆرەکان)، کە ئەیتوانی لەڕێگای پرۆگرامێکی زانستیەوە چارەسەریان بۆ بدۆزێتەوە و بەهیچ شێوەیەکیش زانستی پزیشکیەکەی تێکەڵ بە سیحر و خورافات نەکردووە و پێی وابووە هەموو نەخۆشیەك هۆکارێکی هەیە و هۆکارەکەشی دەبێت بدۆزرێتەوە، هەروەها لە دیاریکردن و دۆزینەوەی هەندێ نەخۆشیدا بەیەکەم کەس دائەنرێت، لەوانە:**

**- دۆزەرەوەی زیندەوەری مشەخۆرە (طفيلة / الإنكلستوما)**

**ئیبن سینا لەکتێبەکەی (القانون في الطب)دا لەبەشی پێنجەم بەناوی (کرمەکانی ڕیخۆڵە) باسێکی دوور و درێژی لە بارەی هۆکارەکانی دروستبونی کرمی لول پێچەوە (الدودة المستديرة) نوسیوە، کە لەزانستی ئێستادا بە (الإنكلستوما)دێت[14]. مامۆستا دکتۆر(محمد خليل عبدالخالق) لەبارەی ئەم کتێبە و گرنگیەکەی لە گۆڤاری (الرسالە)دا نوسیویەتی:( .... ئەوەی ئیبن سینا باسی لێوە کردووە لەبارەی کرمی لول پێچەوە و زانستی ئێستا پێی دەڵێن (الإنكلستوما)، لەرۆژئاوا ٧٠٠ساڵ دوای ئیبن سینا لەلایەن (دوبینی) پزیشکی ئیتاڵیەوە ساڵی (١٨٣٨ز) دۆزرایەوە، کەوا جۆرە کرمێك لە ڕیخۆڵەدا دەژی...)، پاشان بەردەوام دەبێت و دەنوسێ:( دامەزراوەی روکلفری ئەمریکی هەستا بە کۆکردنەوەی هەموو ئەو کتێبانەی کەلەبارەی نەخۆشیەکانەوە نوسراون، پاش پۆلێن کردنیان و سەیرکردنیان بەپێی باسکردنی زۆرترین نەخۆشی کتێبەکانیان ڕیز کرد و یەکەمی ئەم ڕیزبەندیەش کتێبەکەی ئیبن سینا بوو کە زۆرترین نەخۆشی تێدا دەست نیشانکرابوو لەنێو هەموو ئەو کتێبانەی کەلە جیهاندا لەبارەی زانستی پزیشکیەوە نوسراون[15])، هەر لەبەر ئەم گرنگیەشیەتی کەلەلایەن چەندین زانای**

---

[14] د.راغب السرجاني: قصة العلوم الطبية في الحضارة الإسلامية، ص١٨٣.

[15] أحمد فؤاد باشا: التراث العلمي للحضارة الإسلامية ومكانته في تأريخ العلم والحضارة، ص ١٨٠ — ١٨١.

گەورەوە شەرحی بۆ کراوە لەوانە:( ئیمام فخرالدین الرازی، زانا قطب الدین إبراهیم بن علي المصري، پزیشك یعقوب بن غانم کە ناسراوە بە موف السامري، پزیشك یعقوب الكركي، پزیشك ئیبن نەفیس)، هەروەها لەسەر ئەم شەرحانەشەوە دوبارە شەرحکراوەتەوە لەلایەن (قطب الدین شیرازی، محمد الإمامي، سدید الكاذروني، علي زین العرب المصري، علي الإسترابادي، داود الإنطاكي، فخرالدین الخضدي[16]).

- ئیبن سینا لەکتێبەکەی "القانون في الطب"دا باس لە چۆنیەتی پێشوازی کردن لە منداڵ دەکات لەپاش لەدایکبونی و دەڵێ:

"پێویستە کۆرپە لەکاتی لەدایکبونیدا پلەی گەرمی بپارێزرێو لەشوێنێکدا دابنرێ نەسارد و نەگەرم بێت، جگە لەمەش منداڵ دەبێ خاوێن بکرێتەوە و لەپاشاندا شیرێکی باشی پێبدرێت کە شتێکی زۆر سودبەخشە بۆی".

- بەیەکەم کەس دائەنرێت کە جیاوازی کردبێت لەنێوان نەخۆشی سك ئێشەی ڕیخۆڵە و سك ئێشەی گورچیلە.

- ئیبن سینا خاوەنی یەکەمین بیرۆکەی "نەشتەرگەری جوانکاری"یە. لەکتێبە بەناوبانگەکەی خۆی "القانون في الطب" لەبەشێکی تایبەتی کتێبەکەیدا دەڵێ: (بەشی جوانکاری ئەندامەکانی مەچەك و قاچ و لێو و لوت).

لەکۆتای ئەم بەشەدا ئیبن سینا جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە یەکێ لەڕێگاکانی جوانکاری "لێو و لوت و گوێ" نەشتەرگەریە و دەڵێ: (هەندێ کات گوێ و لوت پێویستە لەڕێگای لێگرتنی گۆشتەکەیانەوە یان زیادکردنی شێوەی جوانتریان پێبدرێت).

- دۆزینەوەی جیاوازی نێوان شەلەلی (ناجم) کە هۆکارەکەی ناوەکیە و لەمێشکدایە، لەگەڵ شەلەلی (ناتج) کە هۆکارەکەی دەرەکیە.

---

[16] الشيخ الرئيس إبن سين: فؤاد حمدو الدقس، ص١٥.

- باسـكردن لـەبارەی وەسـتانی مێـشك (الـسكتة الدماغيـة) جيـاواز لـە پزيـشكانی يۆنانی كۆن[17].

- ئەمە جگە لە دياريكردنی چەندان نەخۆشی لەنەخۆشيەكانی ( سـەر و ئێـسكی سەر و نەخۆشيەكانی پێست و دەست قاچ و چاو و گوێ و دڵ و سيەكان و نـاو سك و ئەندامەكانی زاووزێ و منداڵبون و سيللی سيەكان و كۆرپەلـەزانی و .....) كە خۆيان لە ٧٦٠ نەخۆشی و دانانی چارەسەر بۆيان دەبينێتەوە[18].

- دۆزينەوەی چارەسەری نەخۆشی (قورحەی گەدە و ئيلتهابی كۆڵۆن) كە نەپێشتر و نە لەسـەردەمی خۆشـيدا پزيـشكان چارەسـەرێكی دروسـتيان بـۆ ئـەو نەخۆشـيە نەدۆزيبۆوە.

- باسـكردن لـەبارەی چـۆنيەتی ئامـادەكردنی حـەپ و مـەعجون و شـلەمەنی و گيراوەكان وەك چۆن لەرۆژگاری ئەمرۆماندا ئامادە دەكرێن.

- دۆزينـەوەی رێگايـەكی نـوێ بـۆ بەسـپی و پـاك راگـرتنی ددانـەكان و بـۆ ئـەو مەبەسـتەش ماددەيـەكی دروسـتكردبوو تـاوەكو ددانـەكان لـە پـاكێتی و سـپێتی بمێننەوە و دووربـن لـە هـەرجۆرە پيـسبون و دروسـتكردنی كلسێك كـە زەرەر لـە ددانەكان بدات[19].

- چارەسەری شێرپەنجەی مەمكيشی كردووە بـەدەرهێنان و داخكـردن و هـەروەها وەصفی پێكهێنەكان و چۆنێتی داخكردنی شێرپەنجەی كردووە كە زۆر نزيكـە لـە بيردۆزەكانی ئەمرۆ.

<u>لەبواری كيميادا</u>

ئيبن سينا گرنگيشی دايە زانستی كيميـا، بەسـود وەرگـرتن لـەو پێـشينانەی كە هەبون لە زانايانی كۆنی عەجەمی و زانايانی شارستانيەتی ئيسلامی لە وێنەی جابری كوڕی حەييان، بۆ ئەو مەبەستەش هەستا بـە تێكـەڵكردن و كـارلێككردنی مـاددە جياوازەكـان و دروسـتكردنی ماددەيـەكی سـودبەخش لێيـان... ئـيبن سـينا

---

[17] عامر النجار: في تأريخ الطب في الدولة الإسلامية، ص١٣٣.

[18] علي بن عبدالله الدفاع: رواد علم الطب في الحضارة الإسلامية، ص١١٨.

[19] محمود الحاج قاسم: الطب عند العرب والمسلمين، ص ١١٨.

زیاتر کاری کیمیایی بۆ بواره پزیشکیەکەی بەکاردەهێنا تاوەکو لەو ڕێگایەوە گیراوەیەکی باش، ماددەیەکی باش بەرهەم بهێنێت و چارەسەری نەخۆشیەکانی پێ بکات، بەهۆی ئەمەشەوە شارەزاییەکی باشی هەبوو لە کاری (دلۆپاندن و کارلێککردن و سەرخستن و لێکدان و پالاوتن و ....) هەروەها ڕێگایەکی نوێشی تاقیکردەوە لەبەرهەمهێنانی (زیو و ئالتون)[20].

لەبواری فەلسەفەدا

ئیبن سینا یەکێکە لەبەرزترین فەیلەسوفە باوەڕدارەکان و لەهەموو کەس زیاتر لەفارابی دەچێت سەبارەت بەفەلسەفەی بون، گرنگترین دانراوێکیش لەم بوارەدا نوسینی پەیامی (حي بن يقظان/ زیندویی بێدار*)ە و بەنوسەری یەکەمی ئەم بیرۆکەیە دائەنرێت، جگە لەمەش خاوەنی دارشتنی تیۆری (زانین/ المعرفه)یە:

تیۆرەکەی بەبون دەست پێدەکات.... بەپێی ڕای ئیبن سینا وجود لەعەقڵی کارای سەرەتا و یەکەمەوە (خودا) دەست پێدەکات، پاشان قۆناغەکانی تری بون بەدوایدا دێن بەڕادەیەك هەر قۆناغێك لە خوار پلە و پایەکەی قۆناغی پێش خۆیەوە دێت.. یەکەم پلەی بون فریشتەکانن... ئینجا تەنەکانی ئاسمان دێن و هەندێکیان لە هەندێکی دیکەیان بەرزترن، دواتر جیهانی مادی دێت کە توانای لێبونەوە و تیاچونیان هەیە، پاشان ڕەگەزەکان دێن، ئینجا کانزا ڕوتەکان و دواجاریش بونەوەرە زیندووەکان. پێشکەوتوترین بونەوەری زیندوش بریتیە لە

---

[20] عبدالمنعم الهاشمي: العلماء وعباقرة المسلمون، ص٢١٧.

* پەیامی حي بن يقظان، کە باس لەبیرۆکەی ناسینی خودا دەکات لەڕوانگەی عەقڵ و هۆشەوە. دەوترێ ئەصڵی بیرۆکەی ئەم چیرۆکە یۆنانیە و هاتۆتە ناو جیهانی ئیسلامیەوە، ئەویش کاتێ لەلایەن وەرگێڕی ناسراوی سەردەمی خەلیفە مەئمون (حونەین کوڕی ئیسحاق)ەوە چیرۆکەکە لەیۆنانیەوە وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی بەناوی (سلمان و أبسال) کە دواتر ئیبن سینا بەبیرۆکەیەکی فەلسەفی ئیسلامیانە دایڕشتەوە بەناوی (حي بن يقظان) و پاشان سوهرەوەردی بەشێوازێکی عاریفانە دایڕشت بەناوی (چریکەی غوربەی غەریبی)، لەهەمان کاتیشدا ئیبن توفەیلیش بەناوی (حي بن يقظان) و پاشانیش ئیبن نەفیس بەناوی (فاضل بن ناطق).

ئادەمیزادکە پێویستی بەمانەوە و بەگەڕخستنی تواناکانیەتی تا بژی بەشێوەی (کۆمەڵ کۆمەڵ) .... ژیانیش لەگەڵ خەڵکیدا پێویستی بەبونی یاسایەك هەیە نیگای تێدابێ بۆی. ئەو یاسا (نیگا)ش مرۆڤ لە عەقڵی یەکەمیش دەستور و یاسای خۆی دەنێرێ بۆ عەقڵی وەرگر کە لە ڕیزی پێشکەوتوترین نەوەکانی مرۆڤدایە، ئەوانەش بریتین لەپێغەمبەران و فەیلەسوفەکان. جیاوازیش لەنێوان ئەم دوو بەرەیەدا ئەوەیە پێغەمبەر لەڕێگای ڕاستەوخۆ و بەعەقڵی یەکەمەوە وەردەگرێ و بێ فێرکردن چونکە هێزە عەقڵیەکانی بەتواناترە لە عەقڵی خەڵکانی تر. بەلاَم فەیلەسوف توانا عەقڵیەکانی بەدەست دەهێنێت لەڕێگای فێربون و هەوڵی بەردەوامەوە ئینجا یاساکە (نیگا)کە وەردەگرێ لە عەقڵی کاریگەرەوە کە (خودا)یە. بەم پێودانگەش مەنتیق دەیسەلمێنێ کەوا چ پێغەمبەران و چ فەیلەسوفان کاریان ئاراستەکردنی کۆمەڵگا و هۆشیارکردنەوەیانە، هەربۆیە مادام پێغەمبەران تەواوبون تاکە کەسێك بۆ ئەم ڕابەرایەتی کردنە فەیلەسوفەکانن.

هۆکاری کەوتنە ناو ئەم هەڵەیشەوە زانایان بۆ ئەو فەراغە گەورەیە دەیگێڕنەوە کە جیهانی ئیسلامی لەو کاتەدا تێیکەوتبوو لە دۆگمایی و پەرتەوازەیی و مەزهەبگەرایی و لەبەرامبەریشدا بونی ئەو هەموو کتێبە فەلسەفیانەی کە باسیان لەگەورەیی و عەقڵگەرایی بیری مرۆڤ دەکرد، بەلاَم ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە تیۆرەکەی هیچ سودێکی نەبێت، بەڵکو دەتوانرێت سودی باشی لێوەربگیرێ لەڕوی گرنگی بیرمەندان و فەیلەسوفان بۆ بەڕێوەبردن و سەرکردایەتی کردنی وڵات بەلاَم نەك تەنها لەڕوانگەی بیری عەقڵی خۆیانەوە بەڵکو لەبەر ڕۆشنایی قورئان و فەرمودەی خواییەوە.

لەبواری فەلەکدا

ماوەی (٨)ساڵ خەریکی زانستی فەلەك بوو، لەڕێگای سود وەرگرتن لەکتێبەکانی (بتلیمۆس) و بەهاوکاری لەگەڵ قوتابیەکەی ئەبوعبیدە جورجانی و شەوانە لەڕێگای (ئستورلاب و ڕوانگە گەردونیەکان)ەوە تاقیکردنەوە نوێکانی خۆی ئەنجام ئەدا و پاشانیش لەو بارەیەوە کتێبێکی نوسی بەناوی (الإنصاف في الأرصاد في وقت قياسي).

## دژایەتیکردنی

**دژایەتیکردنی ئەم زانایە هەر لەژیانی خۆیەوە دەست پێدەکات، سەرەتا لەناوچەی خۆراسان بەهۆی دژایەتیکردنیەوە کە لە خۆراسان دەرچوو و چووە خوارزم، دواتریش بەهۆی دژایەتیکردنی دەوڵەتی غەزنەویەوە چووە هەمەدان، لەهەمەدانیش بەهۆی دژایەتیکردنی سوپای وڵات و خەڵکی ناوچەکە چووە ئەصفهان و کۆتاییەکانی ژیانی خۆی لە ئاوارەیی کەس و کاری خۆی تەواو کرد.**

**پاشانیش لەلایەن چەندین کەسەوە بەچاویلکەی ڕەشەوە لەبارەی نوسینەکانیەوە قسە دەکەن و بابەت ئەنوسن و ئەیخەنە ڕیزی کەسانی زەندیق و لەدین دەرچوو و دووڕوو و دژە خوا و بێ باوەڕ و کافر و خیانەتکار لەدین و وڵات، بە بەڵگەی ئەوەی ئیبن سینا هەمان بیروباوەڕ و بۆچونی باوکی هەبووە کە کەسێکی باتینی و ئیسماعیلی شیعی بووە و لەدانیشتنەکانی شەوانەی باتنیەکاندا کەلەماڵی ئەوان بەستراوە بەشداربووە، لەکاتێکدا بەوتەی خۆی کەلەبارەی سەرەتاکانی خۆیەوە دەدوێ و دەنوسێ:( باوکم لەو کەسایەتیانە بوو بیروباوەڕی باتنی هەیبوو، براکەیشم بەهەمان شێوە و زۆرجار گفتوگۆیان لەو بارەیەوە دەکرد و منیش گوێم لێدەگرتن بەڵام نەفسم وەری نەدەگرت). بەم بەڵگەیەش ئێمە دەتوانین ڕەددی ئەوە بکەینەوە کەوا ئیبن سینا بەهیچ شێوەیەك باوەڕی باتنی هەبوبێت. ئیبن تەعزی بەردیش چەند وتەیەکی جوان لەبارەیەوە دەنوسێ و وەڵامی ئەوانەوە ئەداتەوە کە دژایەتی دەکەن:( وتم: ئیبن سینا بەم چەشنە نەبووە بەڵکو حەنەفی مەزهەب بووە و لەبەر دەستی پێشەوا ئەبی بەکری کوڕی ئەبی عبداللە ی زاهیدی حەنەفیدا بووە و لەسەرەمەرگدا نەخۆش کەوتووە و تەوبەی کردووە و هەرچیشی شك بردووە و هەیبووە کردویەتی بەخێر و کۆیلەکانی ئازادکردووە و ستەمیشی لەهەرکەسێك کردووە و ناسیویەتی مافی بۆ گەڕاندۆتەوە و لەهەموو سێ ڕۆژ جارێکدا خەتمێکی قورئانی کردووە تا لەڕۆژی هەینی و لەمانگی ڕەمەزاندا کۆچی دوایی کردووە).**

ئیتر بەڕاستی قسەکردن لەدوای ئەمەوە زیادەیە کەبەکەسێکی دووڕوو و زەندیقی بناسین، کە خوای گەورە بۆ خۆی دەرفەتێکی وای پێداوە تاوەکو بگەڕێتەوە و پەشیمان بێتەوە لەو بۆچونانە و تەوبەیان لەسەر بکات.

## کۆتایی ژیانی

شێخی گەورە بەخۆشەویستیەوە ژیا، بەڵام خۆری ژیانی بەرەو ئاوارەبون ڕۆیشت و ڕیش و سەری سپی بوو، وەك بۆخۆی لەشیعرێکدا دەنوسێ:

تنفس في عذارك صبح شيب

وعسعس ليله، فكم التهابي؟

شبابك كان شيطاناً مريداً

فرجم من شيبك بالشهاب

هەروەها دەڵێ:

هو الشيب لابد منه وخطه

فعرضه، واخضبه، وأوغطه

أؤ قلقك الطل من و بله؟

جزعت من البحر في شطه!

یاخود دەڵێ:

الشيب يوعد والأيام واعدة

والمرء يفتر، والأيام تنصرم

شێخی گەورە لە کۆتایی تەمەنیدا نەخۆش کەوت و لەجێگا کەوت، هەربۆیە لەلایەن پزیشکانی ئەصفەهانەوە هەوڵی چارەسەری درا، بەڵام جگە لەخراپتر کردنی حاڵی هیچی دیکەیان لەدەست نەهات، تاوەکو ڕۆژی هەینی یەکی ڕەمەزانی ساڵی (٤٢٨ك) لەدوای نوێژی ئێوارە گیانی لەدەستدا و چووەوە بارەگای خوا، دواتر جەستەکەیان کفن و دفن کرد و لەلایەن ئەمیری ئەصفهان (علاوالدولە) و

**سوپاکەیەوە لەڕێوڕەسمێکی شایستەدا جەستەیان لەسەر چیای هەمەدان بە خاك سپارد[21].**

---

[21] **بڕوانە:**

**د. طه عبدالمقصود عبدالحميد أبوعبية: الحضارة الإسلامية، ج١/ ص٣٢٩. د.أرشيد يوسف بن أرشيد: الحضارة الإسلامية، ص٢٥٨. فؤاد حمدو الدقس: الشيخ الرئيس إبن سينا، ص١٦.**




**ئیبن سینا لەسەر پولی پۆستەی "قەتەر"**







**ئیبن سینا لەسەر پولی پۆستەی "دوبەی" و "جەزائیر"**




**ئیبن سینا لەسەر پولی پۆستەی ئێران**




**ئیبن سینا لەسەر پولی پۆستەی "کوەیت"**


بسم الله الرحمن الرحيم

وێنەیەک لەکتێبی "القانون في الطب"ی ئیبن سینا



كتب القانون في الطب

لابو علي الشيخ الرئيس

ابن سينا

مع بعض تاليفه وهو علم المنطق وعلم الطبيعي

وعلم الكلام

[redacted]

ROMAE,

In Typographia Medicea.

M.D.XCIII.

Cum licentia Superiorum.

35570

**بەرگی کتێبی "القانون في الطب" وەرگێڕراوە بۆ لاتینی و لە شاری (ڕۆما)ی ئیتاڵیا لەساڵی (١٥٩٣)زدا چاپکرا.**



**نوسخەی لاتینی کتێبی "القانون في الطب"ی ئیبن سینا، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ١٤٨٤ز و پارێزراوە لەکتێبخانەی "نیکسونی پزیشکی مێژوویی" لەزانکۆی (تەکساس) کە بنکەی زانستە تەندروستیەکانە لە (سان ئەنتۆنیۆ)ی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا**



**نوسخەیەك لە کتێبی "القانون في الطب"ی ئیبن سینا بە زمانی فارسی لە گڵکۆی "ئیبن سینا" لە هەمەدان**



**گڵکۆی "ئیبن سینا" لە هەمەدان**

**وێنەیەك كەلەلایەن ڕۆژئاواییەكانەوە كێشراوە و نیشانی ئەدات كە ئیبن سینا خاوەنی پلەی یەكەمینە لە زانستی پزیشكیدا و پێشی پزیشكانی كۆنی داوەتەوە**




**وێنەكە لەلای ڕاستەوە: ئیبقرات، ئیبن سینا، جالینۆس**




**وێنەیەك لەكتێبی "القانون في الطب"ی ئیبن سینا كـە بـە شـێوازێكی زۆر جوان بەشەكان دیاری كراوە و شتەكانی بەوێنەوە ڕوون كردۆتەوە**




**كتێبێك لەسەر ئیبن سینا**
**لەلایەن عائیشە خانەوە**
**بە زمانی ئینگلیزی**
**لەساڵی ٢٠٠٦دا.**



**پەیکەری ئیبن سینا لە قونیەی تورکیا کە بەرزی پەیکەرەکە ٧مەترە**



**پەیکەری ئیبن سینا**
**لەتارانی پایتەختی ئێران**

## سەرچاوەکان


١. ابن سينا : القانون في الطب

٢. ابن سينا: الشفاء

٣. د. طه عبدالمقصود عبدالحميد أبو عبية: الحضارة الإسلامية، ج١

٤. عبدالمنعم الهاشمي: علماء وعباقرة المسلمون

٥. إبن أبي أصيبعة: عيون الأنباء

٦. البيهقي: تأريخ علماء الإسلام

٧. / أحمد عطية الله: القاموس الإسلامي، ج١

٨. شوقي أبو خليل: أطلس الفرق والمذاهب الإسلامية

٩. بارون كارادفو/ ت. ع: عادل زغيتر: إبن سينا

١٠. العقاد: شيخ الرئيس إبن سينا

١١. د. أرشيد يوسف بن ارشيد: الحضارة الإسلامية

١٢: محمد فتحي صبري: الشيخ الرئيس إبن سينا

١٣. عبدالمنعم الهاشمي: علماء وعباقرة المسلمون

١٤. فؤاد حمدو الدقس: الشيخ الرئيس إبن سينا

١٥. سيد مجتبى موسوى لارى: ديمەنى شارستانيەتى رۆژئاوا

١٦. د.راغب السرجاني: قصة العلوم الطبية في الحضارة الإسلامية

★ لەگەڵ چەندين سايت و پەيجى بيانى كە وێنە و زانيارى نوێمان لەسەر ئەم كەسايەتيە لێوەرگرتووە.